# ناکۆکییە نێوخۆییەکانی کورد

## سەرچاوە و پەرەسەندنەکانی



**میخاییل لازاریڤ**

**وەرگێڕ: مەنسور سدقی**

**٢٠١٦**

## تێبینی وەرگێڕ:

پرۆفێسوری مێژوو میخائیل سیمۆنویچ لازاریف، پسپۆڕی بەناوبانگی رووس لەسەر مێژووی کورد، ئەو بابەتەی لە کۆنفرانسێکی دوو رۆژە لەسەر کێشەی کورد پێشکەش کردووە کە لە ساڵی 2005دا لە مۆسکۆ و لەلایەن بەشی "کوردناسی و کێشە ناوچەییەکانی" پێکهاتبوو. لەو کۆنفرانسەدا هاوکارانی بەشی رۆژهەڵاتی ناوەند و نزیک لە ئەنستیتوی رۆژهەڵاتناسی رووسیا، پسپۆڕانی‌تری ئەو ناوەندە، نوێنەرانی "ئەنستیتوی دەوڵەتی بۆ پێوەندییە نێونەتەوەییەکانی سەر بە وەزارەتی کاروباری دەرەوەی رووسیا-مۆسکۆ"، ئەنستیتوی رۆژهەڵاتی نزیکی رووسیا و دیاسپۆڕی کورد لە رووسیا بەشداریان کردبوو.

کۆی وتارەکانی پێشکەشکراو لەو کۆنفرانسەدا کە دەگاتە 24 وتار، لەساڵی 2006 و لە توێی کتێبێکی 362 لاپەڕەییدا بەناوی "کێشەی

کورد لە رۆژئاوای ئاسیا لە دەسپێکی سەدەی 21مدا- کۆکراوەی وتار"، بەزمانی رووسی لە مۆسکۆ چاپ و بڵاوکراوەتەە. ئێستاش "ئەنستیتوی رۆژهەڵاتی نزیکی رووسیا" لەماڵپەڕی خۆیدا تەواوی ئەو کتێبەی خستۆتە بەردەستی خۆێنەران.

دیارە هێندێک لە بۆچوونەکانی نووسەر دەگەرێتەوە بۆ هەلومەرجی رابردوو، بەڵام زۆربەی ئاماژەکان بەتایبەت هۆ و هۆکارەکانی ناکۆکی نێوخۆیی کێشەی کورد کاردانەوە و گرنگی خۆیان لەدەست نەداوە. ئەگەرچی لەوانەیە لەگەڵ هێندێک لە بۆچوونەکانی نووسەر هاودەنگ نەبین، بەڵام بەگشتی بابەتەکە شیاوی ورگێڕان و بڵاوکردنەوەیە.

دەقی ئەو وتارە لە ماڵپەری "ئەنستیتوی رۆژهەڵاتی نزیکی رووسیا" وەرگیراوە: "کێشەی کورد لە رۆژئاوای ئاسیا لە دەسپێکی سەدەی 21مدا- کۆکراوەی وتار"، لاپەڕەی 26-37.

ئەو وەرگێردراوە بۆ یەکەم جار لە ژمارە 1ی لۆمۆند دیپڵۆماتیک کوردی (سۆرانی) ساڵی 2010 بڵاوبووتەوە.

بەهێندێک گۆڕانکاری لە رێنووسدا لە مانگی ٦ ساڵی ٢٠١٦ وەک "پەڕتووکی ئۆنلاین" بڵاوبووتەوە-. وەرگێڕ.

## دەسپێک

هیچ بزووتنەوەیەکی نەتەوایەتی نییە، قەوارەیەکی یەکپارچەی هەبێت، تەواویان ئاوێنەیەکی بەرژەوەندییە هەمەلایەنە و تایبەت بەخۆییەکانی چین و توێژە کۆمەڵایەتییە جیاوازەکانی نەتەوەی خۆیانن و بێگۆمان هەریک لەو چین و توێژانە ئاوات و داخوازی سیاسیی دیاریکراوی (کۆنکرتی) خۆیان هەیە و تەنیا یەک ئامانج ئەوانە لێک گرێدەدات و یەکگرتوویان دەکات: وەدەستهێنانی مافی چارەی خۆنووسین بەئاستە جیاوازەکانی کە لە پێناسەکردنی فەرمی جیاوازی ئێتنیکییەوە دەستپێدەکات و هەتاکو وەدەستهێنانی سەربەخۆیی تەواو و پێکهێنانی دەوڵەتی نەتەویی درێژەی دەبێت. بەڵام بۆ چەسپاندنی ئەو ئامانجە سەرەکییە، لایەنەکانی بزووتنەوەی نەتەوایەتی بەشێوازی خۆیان هەڵدەستن کە پێوەندی بە بەرژەوەندی تایبەتی چینایەتی و توێژایەتی و ... ئەو لایەنانەوە هەیە و بەگشتی

بریتیە لە شێوازێکی خۆتەوەر و یەکلایەنانە (ئێگۆئیستی). لێرەدایە کە لە قوناغی خەبات و تێکۆشان بۆ وەدەستهێنانی مافی چارەی خۆنووسین، هۆ سەرەکییەکانی کێشەی نێوخۆیی و نەتەوەیی ئەو بزووتنەوانە دەردەکەوێت.

کێشەی نێوخۆیی، پێناسەی تایبەتی بزووتنەوەی نەتەوایەتی کورد پێکدێنێت. ئەو دیاردەیە لەژێر کاردانەوەی لایەنە تایبەت نێوخۆییەکانی ئەو بزووتنەوەیە پێکهاتووە. تەنانەت لە ساڵی 1934دا، مێژوونووسی بەناوبانگی بریتانیایی، پسپۆڕ و چاوەدێری کێشەکانی رۆژهەڵاتی نێوەڕاست، ئارنۆلد تۆینبی دەنووسێ: «دوژمنی هەرە بەدکاری کورد بریتییە لە کێشمەکێشی فیۆدالی و خێڵایەتی کە بە دەسەڵاتی وڵاتانی ئێراق، تورکیا و ئێران رێگا دەدات بۆ داسەپاندنی سیاسەتی "دابەشکە و حکۆمەت بکە"». کێشەنێوخۆییەکان لە سەرەتای سەدەی 19ەوە هەتاکو ئێستا، گشت مێژووی بزاڤی نەتەوایەتی و رزگاریخوازانەی کوردی هاوڕێیی کردووە. ئەو کێشانە ناتەبایی سەرەکی ئەو بزاڤە بەرجەستە دەکاتەوە کە بریتیین لە: هەوڵ و تێکۆشانێکی زەینی (سوبژێکتیڤ) بۆ یەکگرتنەوە، و دەست نەکەوتنی عەینی (ئۆبژێکتیڤی) ئەو یەکگرتوویی‌یە. گەلێک هۆکاری بنەڕەتی و سەرەکی لەئارادان کە هەمیشە دژی وەدەست هێنانی ئەو یەکگرتنەوە کاردانەوەیان هەبووە. ئەگەرچی هێندێکجار هۆکارە مێژوویی و سیاسەتە نێوخۆیی و دەرەکییەکانیش کەریگەریان هەبووە.

## هۆکارە مێژووییەکان

لەپلەی یەکەمدا پێویستە ئاماژە بە دابەشبوونی سیاسی-جوگرافی گەلی کورد بکەین. گەشەی مێژوویی گەلی کورد و هەلومەرجی سیاسی یەکگرتنەوەی ئێتنیکی کورد (کە بەگشتی لەسەردەمی کۆتایی ساسانیەکاندا، نزیکەی سەدەی شەشی زایینی روویداوە) و وەرچەرخان و گۆڕانی ئەو گەلە بەرەو نەتەوە بوون، هەموویان لە هەلومەرجی ژیانی پارتیکۆلیاری[1] گروپە بەربڵاو و جیاوازەکانی کورد رویانداوە. نیشتمانی مێژوویی و گۆڕەپانی ژیانی هەمیشەیی کۆمەڵانی گەلی کورد واتە کوردستان، هەرگیز مانا و ناوەرۆکی سیاسی-نەتەوەیی نەبووە و تەنیا هەڵگری ناوەرۆکێکی جوگرافی- نەتەوەیی بووە. هیچکات دەوڵەتێک بە ناوی کوردستان کە

---

[1] ناوچەگەرایی، خۆتەوەری، پەڕشوبڵاویی، جیاوازی دانان. ویکیپێدیا. -. وەرگێر.

ئتنۆسی[2] کورد سەرکردایەتی کردبێت، بوونی نەبووە. بەڵکو لەسەردەمی سەدەکانی نێوەڕاست و هەروەها سەردەمی نوێ و نوێترهاوچەرخدا، کوردستان کەوتۆتە چوارچێوەی دەوڵەتەکانی دیکەوە: تا سەدەی شازدە بەشێک لەئیمپراتوریای خەلیفەکان و تورک-مەغۆلەکان، پاشان لەچوارچێوەی ئیمپراتوریای عوسمانی و ئێران و پاش شەڕی یەکەمی جیهانی بووە بە بەشێک لە وڵاتانی تورکیا، ئێران، هەروەها وڵاتانی عەرەبی ئێراق وسوریا کە ماوەیەکی درێژ لەژێر بەرێوەبەرایەتی راستەوخۆ یان سەرپەرەشتی بریتانیا و فەرانسەدا بوون. نە لەو ئیمپراتوریا پڕنەتەوە و سەرەڕۆیانەدا کە ئیمارتە سەربەخۆ و نیوە سەربەخۆکانیشیان گرتبۆوە، و نە لەوڵاتە سەربەخۆکانی هاوچەرخدا، تا ئەو ساڵانەی ئێستاش هەلومەرج بۆ دامەزراندنی ناوەندێکی نەتەوەیی-سیاسی و بۆ یەکگرتنەوەی هەموو کوردان و سازدانی پێگە و بنکەیەکی سەربەخۆیی و دەوڵەتی دەسەڵاتداری کوردی نەڕەخسابوو. لەژێر کاردانەوەی ئەو هۆیانەدایە کە لە نێو کورداندا، نەریتی خەباتی سیاسی یەکگرتوو و پشتگیرانە لەپێناو سەربەخۆییدا چ لەئاست گشت نەتەویی و چ بەلانی کەم لەئاست بەشێک لەنەتەوەی کورد، بزرە و بوونی نییە.

هەروەها هۆکاری‌تری مێژوویی بریتیە لە لێکداپراویی ئێتنۆکولتووری و ئێتنۆکۆمەڵایەتی کە تا ئێستا لە ناو کورداندا بەردەوامە. قۆناغی خێڵایەتی کە زۆربەی هەرە زۆری نەتەوەکانی جیهان ئیتر لەمێژە تێپەڕیان کردووە، لە لای کوردان و لەپێکهاتەی کۆمەڵایەتی ئەواندا بەهۆی گەلێک هەلومەرجی نالەباری نێوخۆیی، بەشێوەیەکی

---

[2] Ethnos

بەردەوام درێژخایەن بووە و جێگای لەناو نەریتە مێژووییەکانی کورداندا کردۆتەوە و تائێستاش کاردانەوەی بەردەوامە. ئەو دیاردەیە بۆتە هۆی درێژخایەنی هەمەلایەنەی رەوتی لەسەرەخۆی گەشەی کۆمەڵایەتی و کولتووری نەتەوەی کورد کە هێندێک لە لایەنە گرینگەکانی ئاڕاستەیەکی "پارتیکۆلیاری" بەخۆ گرتووە و کاردانەوەی لە سەر زمان و ئایین و ... پێناسە ئێتنۆکولتوورییەکانی داناوە و بۆتە هاندری لەتوپەتکردن و جیاوازیدانان و ناوچەگەرایی و تا ئێستاش لەناو کورددا رەوتی یەکگرتنەوە و هەڵگرتنی یەک پێناسەی ئێتنیکی- نەتەوەیی دژوار کردووە. رەوتی یەکگرتنەوە و هەڵگرتنی یەک پێناسەی ئێتنیکی بۆ کورد، ئێستا بەسەرئەنجام نەگەیشتووە، بەڵام ئەو ناکامییە زۆر گرنگ نییە و پێیناوێت زۆر گەورە بکرێتەوە.

ناکامی رەوتی یەکگرتنەوەی ئێتنیکی گەلی کورد لەوسەردەمەدا، وەک سەرچاوەی تائێستابەردەوامی دابەشبوونی ئێتنۆکولتووری و ئێتنۆکۆمەڵایەتی گەلی کورد، هێندێک لایەنی نەرێنی [نێگاتیڤی] سیاسی پێکهێناوە و رەنگە سەرەکی‌ترینیان بریتی بێت لە هەڵسوکەوت و کولتووری سیاسی نزم وەک رەنگدانەوەیەک لە کولتووری پاشکەوتووی جەماوەریی خەڵک کە تایبەتمەندییە باوەکانی بزووتنەوەی کوردی برجەستە دەکاتەوە، وەک: گەورەکردنەوەی سامناکی کەسایەتییە سیاسییەکان و هەر کردەوەیەکی سیاسی بەگشتی، سەرۆک پەرەستی و هاوکات ئامادەبوون بۆ کردەوە توندوتیژەکان لە خەباتی سیاسیدا.

سەرچاوەی مێژوویی کێشەکە، هۆکاری خۆی هەیە کە هەلومەرجی هەنووکەیی کومەڵگای کوردی پێشاندەدات. وەک

فرەژێرخانی [فرەستروکتوری] و ناهاوتەریبی گەشەی کۆمەڵایەتی-ئابووری کە لە پانتایی و قوڵاییدا کاردانەوەیان داناوە و سازدەری هۆ گرینگەکانی پەرشوبڵاویی سیاسی کۆمەڵگای کوردەوارین. جیاوازی لە پلەوپایە و پێگەی کۆمەڵایەتی-ئابووریدا، جیاوزی لە هەلوێستە جیاوازە سیاسیەکان لە پانتایی ناوچەکانی کوردستاندا دیاری دەکات. بەرهەمی ئەو جیاوازییە لە ئاستی کولتووریدا، هەروەها کاریگەری هەبوو لەسەر دێزئێنتگراسیونی [نایەکگرتوویی] تێکۆشان و هەوڵەکان لە بزاڤی نەتەوەییدا.

لە بزووتنەوەی نەتەوایەتی کورددا، تاراوگە [دیاسپۆر] هەمیشە نەخشێکی سیاسی تایبەتی گێڕاوە. لەسەردەمی هەنووکەیی و لەناو کورددا، تاراوگە شوێنێکی کۆمەڵایەتی-کولتووری تایبەت بەخۆی گرتووە. ئەگەرچی ژمارەی دیاسپۆری کورد زۆر کەمە (نزیکەی 4% ئاپۆرای کورد و پتر لە 1 ملیۆن کەس دەگرێتەوە)، بەڵام بەشی هەرە خوێندەوار، هەرە سیاسی و هەرە چالاکی ئەو نەتەوەیە پێکدێنێت. دیاسپۆری کورد بەپێی درێژخایەنی و ماوەی بوونی (لەتەواوی ژیانی خۆیدا ئێستا جیلێکی تێپەڕ نەکردووە) لە وڵاتانی پێشکەوتوو و خاوەن شارستانیەت- لەرابردوودا لە ئیمپراتوری رووسیا-USSR- و هەنووکە بەلانی زۆرەوە لە وڵاتانی رۆژئاوادا- نەتەنیا شێوازی ژیانی ئەو وڵاتانەی هەڵگرتووە، بەڵکو زۆربەی لایەنە بەنرخەکانی ئاکاری سیاسی و کولتوورییەکانیشی وەدەست هێناوە و لە هەمان کاتدا بنەمای شوناس و پێناسەی نەتەوەیی خۆی لەدەست نەداوە. بەڵام دیاسپۆری هەنووکەیی کورد بەهۆی تایبەتمەندییە مێژووییەکانی پێکهاتەی کۆمەڵایەتی، کولتووری و سیاسیەوە، ناهاوتەرازی و

نایەکدەستبوونێکی زۆری پێوە دیارە کە هێندێک ئاسەواری هەبووە و پەرەسەندنی ناتەبایی لەنێو بزووتنەوەی نەتەوایەتی کوردی لێکەوتۆتەوە.

لەلایەکەوە، لەمێژە کۆچبەرانی کورد و زۆرتریش لە وڵاتانی رۆژئاواییدا، بۆنەتە نێوەندێکی رۆشنبیری-سیاسی بۆ ناسیونالیزمی کورد لەدەرەوەی وڵات. دوایین چالاکی، بریتی بوو لە دامەزراندنی "لقێکی" فرەتایبەت لە لوبنان. نۆخبەی کورد لە تاراوگە کە ببوو بە هەڵگری بیرۆکە و کولتووری سیاسی سەردەمیانە و پێشکەوتووی ئەو چاخە، هەوڵی دا تا ئەو دەسکەوتانەی بۆ وڵاتی خۆی بگوازێتەوە و بڵاوی بکاتەوە. بەڵام زوو دەرکەوت کە ئەوە ئەرکێکی ئاسان نییە. هەلومەرجی راستەقینەی کوردستان جیاوازیەکی زۆری هەبوو لەگەڵ ئەو وێنایەی لەدەرەوە بیری لێدەکراوە (ئەوە رەهەندێکی ئاساییە بۆ هەموو کۆچبەران). لەوڵاتدا رێبەرانی کاریزما و بیرۆکەی ئایینی و نەریتی "سەرچۆپیان" بەدەستەوە بوو، واتە ئەو کەسایەتییە سیاسی- ئایدیۆلۆژێکانە کە گەلێک جار هەڵسوکەوتی کۆنی "فێودالی-پارتیکۆلیار"یان پێوە دیارمابوو. بەراستی لەو دواییانەدا زۆربەی رێبەرانی ناوداری کورد ئاشکرا بەشێوەی "وێستەرن"ی هەڵسوکەوتیان دەکرد، مخابن ئەو رەوتە ئێستاش کۆتایی پێنەهاتووە. بۆیە هۆیەکانی بابەتی (ئۆبژێکتیف) بۆ رەخسانی بواری لێک تێنەگەیشتن هەر پایەدارن و هەمدیسان بۆیە تێکهەڵچوونی راستەوخۆی نێوان "کۆن" و "نوێ" لەبزووتنەوەی نەتەوایەتی کورددا، هەر بەردەوامە.

لەلایەکی‌ترەوە، لە دە ساڵی رابردووی ئەم سەدەیەدا، لەباری کۆمەڵایەتی و دیارە لەباری سیاسیشەوە، گۆڕانێکی گرنگ لەپێکهاتەی "دێمۆگرافی" دیاسپۆری کوردا رویداوە. ئەگەر لەرابردوودا، تاراوگەی کورد لەهەڵبژاردەکان (ئەریستوکراتەکان) و نۆخبەکانی کۆمەڵگای کورد پێکهاتبوون، پاش نیوەی دووەمی سەدەی بیستەم کاروانی کۆچبەرانی کورد بەتایبەت چین و توێژی زەحمەتکێشی کورد وەک"کرێکاری میوان" بەرەو وڵاتانی رۆژئاوا تا رادەیەکی یەکجار زۆر زیادی کرد کە لەسەرەتادا، رادەی خوێندەواری و کولتووری بەرچاویان نەبوو. خۆرێکخستن لەگەڵ هەلومەرجی ژیانی تاراوگە بۆ ئەو کۆچبەرانە زۆر بەئەسپایی تێدەپەڕی، ئەگەرچی بەهەڵسەنگاندن لەگەڵ ژیان لە نیشتمانی مێژوویی خۆیاندا جیاوازی یەکجار زۆری پەیداکردبوو، بەڵام هەر ئەو هەلومەرجە یارمەتیدەری پێکهاتنی بیروبۆچۆنی توندوتیژ، بەتایبەت لەناو لاوانی کۆچبەری کوردی پێکهێنا.

لەناو دیاسپۆری کورددا توێژێکی "مارگیناڵ"[3] سەریهەڵدا کە هەڵسوکەوتی باڵە چەپرەو و سەرکەشەکانی وڵاتی نێشەجێیان لاسادەکردەوە. بەکورتی، دیاردەی روو لە هەڵکشانی جیابوونەوە و ناتەبایی لەسەر بنەمای بۆچوونە سیاسییەکان، پێناسەی دیاسپۆری کورد لەم سەردەمەدا پێکدێنێت.

---

[3] Marginal لە وەشەی لاتینی margo وەرگیراوە بەمانای کەنار، لێوار. مارگیناڵ بەو کەسانە دەگوترێ کە لە لێوارەکانی تۆژێک کۆمەڵایەتی و یان سیستەمێک و یان کولتوورێک هەستاون و هەڵگری دابونەرێتێکی دژن لەگەڵ دابوتەریتەکانی ئەو شوێنەی لێی هەستاون. هێندێکجار بەهەڵە بەچێی "لۆمپەن" بەکار دێت. ویکیپێدیا. -. وەرگێر.

## هۆکارە سیاسییە نێوخۆییەکان

دیارە هەر هەلومەرجێکی کێشەدار و تێکهەڵچوونێکی بۆ نەتەوەیەک کە لەپێناوەی مافی چارەی خۆنووسین خەبات دەکات، لەسەر بەستێنی نەتەوایەتی و پانتایی سیاسی ئەو وڵاتەی کە تێیدا جێگیر بووە و ژیانی تێدا دەکات، پێکدێت. ئەوە راستییەکی حاشا هەڵنەگر و بنەڕەتییە و نەتەنیا بزووتنەوەی کوردیش دەگرێتەوە بەڵکو نەخشێکی زۆر گرنگ و تایبەتمەندیش لەرەوتی دامەزراندن و گەشەسەندنی ئەو بزووتنەوەدا دەگێڕێت. ئەو کێشەیە دەگەڕێتەوە بۆ دابەشبوونی کوردستان لەباری دەوڵەتی-سیاسییەوە، کاتێک لە چەند وڵاتی جیاواز، و دیارە بەو پێیە لە چەند دۆخی جیاوازی کۆمەڵایەتی-سیاسی و کولتووریدا، ئەو بزووتنەوەیە سەر هەڵدەدات. لەئاکامدا، لە ناو بزووتنەوەی نەتەوایەتی کورددا و هەر لە سەرەتاوە نەتەنیا ئاڕاستەی هزری یەکگرتنەوە (خەبات لەپێناوی کوردستانێکی سەربەخۆ و یەکگرتوو) دەبیندرێ، بەڵکو ئاڕاستەیەکی سیاسی خۆجیاکردنەوە، واتە "پارتیکۆلیاری"ش پێکدێت کە لە بەردەوامی ئەو

بزووتنەوەیەدا وەک سەرچاوەی کێشە و تێکهەڵچوونە نێوخۆییەکان رەنگدەداتەوە. ئەگەر ئاڕاستەی یەکەم بەشێوەیەکی گشتی خاوەنی بنەمایەکی بیرۆکەیی [ئایدۆلۆژیک] بووە، بۆچوونی دووەم لەژێر کاردانەوەی عەینی [ئۆبژێکتیڤی] هەلومەرجی واقیعی [رێئاڵی] کۆمەڵایەتی-سیاسی ئەو وڵاتانەی کوردی تێدا دەژی، پێکهاتۆوە. هەلومەرجی ئەو وڵاتانە لە لایەکەوە لەباری پێوەندییەکانی قۆناخی-چاخی، مێژوویی-کولتووری و شارستانییەوە زۆر وێکدەچن و لەلایەکی دیکەوە، بەشێوەیەکی بەرچاو، پێش هەموو شتێک لەباری نەتەوەیی و سیاسییەوە، لێک جیاواز دەبنەوە. دیارە تایبەتمەنییەکانی ئەو وڵاتانەش مۆر و نیشانی خۆیان لەسەر بزووتنەوەی نەتەوایەتی کورد دادەنێن. لە هەریەک لەو وڵاتانە (تورکیا، ئێران، عێراق و سوریا) ئەو بزووتنەوەیە هاوشان لەگەڵ بیرۆکە و ئاواتی یەکگرتنەوەی نەتەوایەتی گشتگیری کورد، بەڕوونی تایبەتمەندییە خۆجێییەکانی زمانی، ئایینی، کولتووری-مێژوویی، کۆمەڵایەتی-ئابووری و سیاسی پێوە وەدیار دەکەوێ کە ئەوەش بەگشتی بزووتنەوەکە بەرەو چەند ئاستی جیاوازی گەشەی نەتەوەیی دەبات.

لە کوردستانی تورکیای ئەو سەردەمەدا جگە لە ناوچەی تونجەلی (درسێم)، دەکرێ بڵێین سیستەمی خێڵایەتی باوی نەماوە، مخابن لە کوردستانی عێراقدا ئێستاش پایەدارە و تەنانەت بەردەوام مەترسی پەرەسەندنی بەرەو ئیسلامخوازی سیاسی لێدەکەوێتەوە. لە کوردستانی تورکیا بەڵام بەدبەختیەکیتر هەیە: دەسەڵاتی ئەو وڵاتە بەتەواوی حاشا لە بوونی نەتەوەی کورد دەکات و بەشێوەیەکی بێبەزەییانە سەرهەڵدانی هەر دیاردەیەکی نەتەوایەتی سەرکوت

دەکات کە لەئاکامدا بۆتە پێکهێنەری بنەماکانی رادیکالیزم و شێوازی توندوتیژی لەبزووتنەوەی نەتەوەیی کورددا. ئاسۆیەک بۆ سەرکەوتنی ئەو شێوازە چاوەڕوان ناکری و مخابن گەلێک دژواری زۆر گرنگی نێوخۆیی و دەرەکی لێدەکەوێتەوە. لە ژیانی سیاسی کوردستانی ئێراندا تا ئێستاش هەست بە کاردانەوەی تاقمە ئایینییە نەریتییەکان (سۆفیگەری) دەکرێ، بەڵام هاوکات خودی بزووتنەوەی نەتەوەیی، شارستانێەت و گەشەیەکی زۆرتری پێوە دیارە کە ئێستا لەخزمەت دامەزراندنی کاکڵی دەسەڵاتی نەتەوەیی و سەربەخۆی کورد لە کوردستانی ئێراقدایە. باشووری کوردستان بۆتە ناوەندی سیاسی و کولتوری بزووتنەوەی نەتەوەیی-رزگاریخوازانەی گشتگیری کورد. لە سووریا و لوبنان (بەگشتی لە ئاست ژیان لەشارەکاندا) هەلومەرج بۆ خۆپێشاندانی نەتەوەیی و کوردایەتی، تا رادەیەک رەخساوە.

وەک لەسەرەوە ئاماژەی پێکرا، تایبەتمەندی رژێمە سیاسییەکان و یاساورێسا کۆمەڵایەتی-ئابوورییەکانی وڵاتانی لێجێگیربووی زۆربەی دیاسپۆری کورد، کاردانەوەیەکی بەرچاوی لەسەر بزووتنەوەی کورد و هەڵسوکەوتی بێرۆکەیی و کردەوەیی داناوە. لەزۆربەی کۆچبەرە سیاسی و خوێندکارانی کورد کە لە خاکی یەکێتی سوڤیەتدا (پێش رووخانی) خۆیان گرتبۆوە و دیارە بەشێکی بەرچاویان ببوونە دیلی بیرۆکەی تۆتالیتاریەتی [سەرەڕۆیانەی] کۆمۆنیستی، کادری رۆشنبیری مەیلەوچەپ و چالاکانی سیاسیان لێ پێکهاتووە. ئەوە کەمتاکورت کۆچبەرانی کورد لەوڵاتانی "بەرەی سۆسیالیستیش" دەگرێتەوە. دیارە دیاسپۆری کورد لە وڵاتانی "جیهانی ئازاد" (ئەرۆپای رۆژئاوا، ئامریکای باکوور، ئۆسترالیا) کەوتووتە ژێر کاردانەوەی

بەستێنێکی بیرۆکەیی و کۆمەڵایەتی بەتەواوی جیاوازتر. دیاسپۆری کورد بەشی هەرە زۆری کوردانی دەرەوی کوردستانیان پێکهێناوە کە بۆ هەڵگرتنی بیرۆکەی پلۆرالیزمی سیاسی لەبارن. تەنانەت گشت دیاسپۆری کورد بوونەتە بزوێنەرە جوربەجور و زۆرجاریش دژبەیەکترەکان و لە پێکهاتنی باڵ و لایەنە جیاوازەکانی بزووتنەوەی نەتەوەیی کورد کاردانەوەیان داناوە. هەروەها بەهەڵسەنگاندن لەگەڵ هەلومەرجی نەگونجاو لە نیشتمانی مێژوویی کورددا (مەبەست جگە لە بەشی هەڵکەوتوو لە عێراق تا ماوەیەک لەمەو پێشە)، تاراوگە بەستێنێکی لەباری بۆ خەباتکارانی رێگای ئازادی کوردستان لە بوارەکانی رێکخراوەیی، راگەیەندن و پرۆپاگاندە، پێکهێنابوو.

بەو شێوەیە، هۆکارە نێوخۆییەکان بەهیچ شێوەیەک یارمەتیان بەیەکگرتوویی بزووتنەوەی نەتەوەیی نەدا و یەکگرتنەوەی باڵە جیاوازەکانی پێک نەهێنا و لەناوبردنی خێرای نەریتی پارتیکۆلیاریزمی سیاسی کوردی لێنەکەوتەوە. ئەو بزووتنەوەیە هەر لەسەرەتاوە و بەپێی سرۆشت و ناوەڕۆکی خۆیەوە، هەڵگری بنەمایەکی عەینی [ئۆبژێکتیڤی] بۆ ناتەبایی بووە کە پێکدادانی بەهێزی لێکەوتۆتەوە و زیانێکی بەرچاوی لە بزووتنەوەکە داوە. لێرەدا پێویستە ئاماژە بە لایەنە زەینیەکان [سۆبژێکتیڤەکان] بکەین کە لە عەقلییەتی نەتەوەیی تایبەت بەکوردەوە سەرچاوە دەگرن. ئەو عەقلیەتە بریتیە لە پێکهاتەیەکی ئێتنۆپسیکۆلۆژی لە ناشێلگیری، خێرا هەڵچوون، مەیل و کردەوەی توندوتیژیی، هاوکات داخراو لەسەر دەرەوەی خۆیدا و تا رادەیەک تاکەکەسانە و تاکڕەوانە.

**هۆکارە دەرەکییەکان**

بەپێی دوو کێشەی سەرەکی و تایبەت، واتە ڕێئالیتێتی(ڕاستەقینەی) جوگرافی-سیاسی کە بەرهەمی مێژوویە بۆ کورد، و ڕێئالیتێتی سیاسەتی نێوخۆیی لە وڵاتانێک کە خاکی کوردستانی لێهەڵکەوتووە، هۆیەکانی کێشە فرە توندە نێوخۆییەکان لە بزووتنەوەی نەتەوەیی کورددا کۆتایی پێنایەت. لێرەدا، هۆکارە نێونەتەوەیی و سیاسییە دەرەکییەکان نەخشێکی تایبەت و ئەگەر نەڵێین سەرەکی، بەڵام گەلێک گرنگیان گێڕاوە. چونکوو کاتێک کێشەی کورد ڕاستەوخۆ هەڵگری بەرژەوەندییە بنەڕەتی و بژێوییەکانی هێندێک لە وڵاتانی ڕۆژهەڵاتی وەک ڕووسیا و وڵاتانی ڕۆژئاوایی و لەسەرەوەی هەموویان وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بێت، ئەو کێشەیە ئیتر بەگشت تایبەتمەندییە هەنووکەییەکانی خۆییەوە ڕوخسارێکی نێونەتەوەیی و گلۆباڵ بەخۆوە دەگرێت.

ڕۆژهەڵاتی نزیک (واتە، ڕۆژئاوای ئاسیا- ئیران، تورکیا، وڵاتانی عەرەب لەڕۆژهەڵات) بەهۆی هەڵکەوتەی جوگرافی لە پێوەندگەی

سێ کیشوەری گۆی زەویدا، تایبەتمەندی جوگرافی- سیاسی (ژێئۆپۆلیتیکی) پەیداکردووە و بەپێی ئەو تایبەتمەندییە و بەدرێژایی سەدان ساڵ، یەکێک لە ناوچە هەرە قەیراناوییەکانی جیهانی پێکهێناوە و بۆتە سەرچاوەی تێکهەڵچونە بێکوتاییە سیاسی- دیپلۆماسی و سەربازییەکان نەتەنیا لە پانتایی ناوچەکە، بەڵکو لەئاست گشت جیهاندا. کوردستان لەو ناوچەیەدا گۆڕەپانێکی ستراتێژیکی سەرەکی لەخۆگرتووە و بەهۆی شاخاویی بوونی و دانیشتوانی ئازادیخواز و شەڕکەرەکەی بریتیە لە قەڵایەکی سرووشتی و هەمیشە وەک "بنکەیەکی ئاگرین"، گرنگیی پلەیەکەمی هەبووە و ناوچەی تێکهەڵچوونی بەرژەوەندییە ناتەبا و فرەقەیراناوییەکانی گەلێک لە گەلان و وڵاتانی پێکهێناوە. تا سەرەتای سەدەی نوزدەهەم سەرەکی‌ترین لایەنەکانی ململانی پاوانکردنی خاکی کوردستان بریتی بوون لە ئیمپراتوری عوسمانی و ئێران. پاشان وڵاتە زلهێز و داگیرکەرە ئۆروپییەکان هاتنە ئەو گۆڕەپانەوە: رووسیا (پاش لکاندنی خاکی قەفقاز)، بریتانیا و دواتریش فەرانسە و ئاڵمانیا، هەروەها پاش کۆتایی شەڕی یەکەمی جیهانی، وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا سرنجی بۆ لای کوردستان راکێشرا. هەنووکە زلهێزی سەرەکی بۆ کەڵکوەرگرتن لە کێشەی کورد لەپێناو بەرژەوەندی خۆیدا، وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکایە کە بریتانیاش بە گشتی هاوکاری دەکات. تایبەتمەندی سەردەمی پاش شەڕی دووەمی جیهانی تێکەڵ بوونی کارای دەوڵەتەکانی رۆژهەڵاتی نزیکە لە ململانێ بۆ زاڵبوون بەسەر هەلومەرج لە کوردستاندا، واتە تورکیا، ئیران، عێراق و سووریا، بەڵام ئیتر ئەم جارە نەتەنیا لەژێر کاردانەوە و هاندانی زلهێزەکانی

ڕۆژئاوایی (وەک لەسەرەتا و لەنێوان دوو شەڕی جیهانیدا روویدا) بەڵکو بەپێی بەرژەوەندییەکانی خۆیان، راستەوخۆ تێکەڵاوی ئەو ململانییە بوون.

هاندەری پاوانکردنی کوردستان تەنیا هەلومەرجی جوگرافی-سیاسی و جوگرافی-ستراتیژیکی ئەو ناوچەیە نییە. لەگەڵ ئەمانەدا، بەرژەوەندی فرەبەرچاوی جوگرافی-ئابووریش دێتەگۆڕێ. باشووری کوردستان (لە عێراق و سوریا) و بەشێک لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان لە ناوچە سەرەکییەکانی پاشکۆی نەوتی جیهاندا هەڵکەوتوون. لەئاکامدا بەستێنێکی ئاڵۆز و فرەدژوار لە ویست و کردەوە پێکهاتووە کە هێندێکجار گەلێک ئاکامی ناتەبا و دژبەیەکتری لێدەکەوێتەوە.

لێرەدا پێویستە سیاسەتی ئەو وڵاتانەی ڕۆژهەڵاتی نزیک کە خاکی کوردستانی لێهەڵکەوتووە، بەتایبەت جیابکرێتەوە. سیاسەتی ئەو وڵاتانە بەهەڵسوکەوتی یەکجار دوژمنکارانە لەبەرامبەر بزووتنەوەی نەتەوەیی کورد و لەگەڵ هەڵوێستی گەلی کورد (جا چ راستەقینە بێت یان گۆمانلێکراو) بۆ مافی چارەی خۆ نووسین و تەنانەت بەلانی کەم بۆ پێناسەی حقوقی و ناساندنی راشکاوانەی پێناسەی نەتەوەیی، بەرجەستە دەبێتەوە. هەڵوێستی سیاسی و دژبەکوردی ئەو دەوڵەتانە دوو روخساری هەیە. یەکیان رووی لە ناوەوەیە و ئەوەی دیکە رووی لە دەرەوە.

بەڵام لەئاست کوردی "خۆجێیی"دا، سیاسەتێکی راستەوخۆ دەگێرن: لە تیرۆری بەربڵاو و سەرکوتکردن بگرە (بەتایبەت لە تورکیا)، هەتاکو شێوازە جوربەجورەکانی گوشاری سیاسی و بیرۆکەیی، بۆ لەناوبردنی بنەڕەتی و یان دامرکاندنی هەست و ویستی

بەرهەڵستکاری نەتەوەیی. ئێران، پرۆپاگاندەی بەربڵاوی ئیسلامی لەپێناو ئەو ئامانجانە دەکات و لە سەرانسەری خاکی کوردا ندا بەشێوازێکی کارا هەوڵی پەرەپێدان بە "جاشایەتی" و کۆکردنەوەی خۆفرۆشانی کورد دەدات.

لەلایەکی‌ترەوە، ئەو وڵاتانە لەئاست کوردی "دەرەوە" و لە پارچەکانی‌تری کوردستاندا، سیاسەتێکی نەرمتر دەگێڕن کە بەئاڕاستەی سیاسەتێک دەڕوا بۆ لاوازکردنی ناوەرۆکی هێزە بەرهەڵستکارە نەتەوەییەکان و پێشگرتن لە دامەزرانی هەر بنکەیەک کە بتوانێت وەک بنەمایەکی کارای یەکگرتنەوەی لایەنەکانی دەوڵەتێکی یەکگرتوو و سەربەخۆی کورد کاردانەوەی هەبێت، جا چ بۆ خۆدمۆختاری یان چ بۆ سەربەخۆیی و لە هەرشوێنێک بێت. بۆ بەڕێوەبردنی ئەو سیاسەتە هاوکات لەگەڵ بەهێزکردنی کاری جاسوسی لەناو سەرۆک خێڵ و پیاوە ماقوڵە (شێخە) دژبەیەکەکان، بەتەواوی هێزیانەوە ناتەباییە نێوخۆییەکان کە خاوەنی سەرچاوەیەکی کۆنی مێژوویین، هەڵدایسێننەوە. هەروەها ناتەبایی رێکخراوە سیاسیە جیاوازەکانی کورد توندوتیژتر دەکەن و بەرەو تێکهەڵچوون و شەڕی چەکداری لەنێوان لایەنەکانی بزووتنەوەی بەرهەڵستکاری کورددا بەربڵاوتر دەکەنەوە. بۆ ئەو مەبەستە لە کەرەسە و شێوازی بەرفراوان کەڵک وەردەگرن وەک: لە پرۆپاگەندە، کاری سیاسی- جاسوسی، کەڵکوەرگرتن لەخۆفرۆشان و هتد بگرە تاکو، تەنانەت دەستێوەردانی ئاشکرای سەربازی، هەر وەک لە کوردستانی عێراقدا قەوما.

بەهۆی کردەوە ئاشکرا و نەهێنییەکانی وڵاتانی ناوچەکە لە کوردستان، زیانێکی بەرچاوی لە بزووتنەوەی کورد کەوتووە، ئەو کردەوانە گشت تێکهەڵچوونە نێوخۆییەکانی بزووتنەوەکەی لێکەوتۆتەوە، راستەوخۆ لەخزمەت بەرگریکردن لە یەکێتی ئەو بزووتنەوەیەدا کاردانەوەی هەبووە و بۆتە هۆی لێکداپڕانێکی قووڵ لەناو هێزە بەرهەڵستکارە نەتەوەییەکاندا. هاوکات، هەوڵی هێندێک لە وڵاتانی ناوچەکە بۆ کەڵکوەرگرتن لەو هەلومەرجە دژوارانەی هەر یەک لە پارچەکانی کوردستان بە سوودی بەرژەوەندییەکانی خۆیان، زۆرجار ئاکامی چاوەڕوان لێکراو و لەپێش داڕێژراوی بۆیان نەبووە. تەنانەت لەخودی ئەو وڵاتانەدا مەترسی پەرەسەندنی دژواریی کێشەی کورد و کێشەکانی‌تری لێکەوتۆتەوە و لایەنە بەهەڵستکارەکانی کوردیش توانیویانە هێندێک سوود لەو نێوەدا وەدەست بێنن.

ئاسەواری خۆتێوەردانی زلهێزەکانی ئوروپایی و وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە ژیانی ئاڵۆزی سیاسی هەرێمی کورداندا، هەر وەک دەستێوەردانی وڵاتانی ناوچەکە ئاکامی ناتەبا و ئاڵۆزی لێکەوتۆتەوە. هەر یەک لەو زلهێزانە بەلەپێشچاوگرتنی بەرژەوەندییە سەربازی-سیاسی و ئابووریەکانی خۆیان تێکەڵاوی ئەو یارییە بوون. دیارە ئاواتە نەتەوەییەکانی گەلی کورد بایەخی بۆیان نییە. سەرەڕای ئەوەش، دامەزراندنی کوردستانێکی یەکگرتوو و سەربەخۆ وەک کۆتایی سرووشتی خەباتی رزگاریخوازانەی گەلی کورد بەهیچ شێوەیەک بۆ ئەو زلهێزانە کە سرنج و کاردانەوەیەکی نەریتییان لە کاروباری رۆژهەڵاتی نزیکدا هەیە، گونجاو نییە، جا چ لەروانگەی لێکبڵاو و پارچەبوونی ناچارانەی چوار وڵاتی رۆژهەڵاتی نزیک و

داسەپاندنی پشێویی و ئاژاوەیەکی تەواو لە سیستەمی پێوەندییە نێونەتەوەییەکان لە ناوچەکەدا کە گەلێک مەترسیدارە، و یان چ بەهۆی ئەو ئاکام و سەرئەنجامانەی کە نادیارن و پێشبینی ناکرێن. ئەوە تاقە رەهەندی ستراتێژیکیی سیاسەتی رۆژئاوا و رووسیا لەرۆژهەڵاتی نزیک پێکدێنێت. بەڵام سەبارەت بە تاکتیک لە قۆناغی دیاریکراودا و لەهەمبەر وڵاتە جیاجیاکاندا، هێندێک جیاوازی لەسیاسەتی "کوردیی" زلهێزەکان وەدیار دەکەوێت.

هەریەک لەو زلهێزانە بەکەڵکوەرگرتن لە تێکۆشانە جیاجیاکانی کوردان لەپێناو چارەسەری کێشەکانی خۆیان لەوڵاتە جێنیشتبووەکانیاندا، بەشێوەیەکی تەواو پراگماتیکی [کردەگەلی]، یان دەتوانین بلێین کرداری- هەڵسوکەوتیان لەگەڵ کێشەی کورد کردووە. لێرەدا بەرژەوەندی نەتەوەیی خودی کوردان، بۆیان لە دوایین پلەی گرنگیدا بووە. گرنگی هەرە زۆرتر بۆ ئەو زلهێزانە پاوانکردنی پێگەی سەرەکی لە "قەلەمندارەی" کوردستان و بەرتەسککردن و وەلانانی رەقیبەکانەیان لەوێندەرێ بووە. تەنانەت بۆ وەدەستهێنانی ئەو ئامانجە فرەتایبەت و داگیرکارانە، گەرەکیان بوو کەڵک لە بزووتنەوەی کورد وەربگرن و هەوڵیاندا دەستەمۆی بکەن و لەژێر چاوەدێری توندوتیژی خۆیان رایبگرن.

بەڵام لە دوایین ئامانجیاندا زۆر سەرکەوتوو نەبوون، بزووتنەوەی کورد لە هێندێک لە پارچەکانی کوردستاندا بەکەڵکوەرگرتن لەپشگری ئاشکرا و نەهێنی تەنانەت خودی ئەو زلهێزە داگیرکەرانە- سەرکەوتنی بەرچاوی وەدەست هێناوە. بەو شێوەیە دەستێوەردانی زلهێزەکان، لەلایەکەوە گێرەوکێشەیەکی یەکجار زۆری لێکەوتۆتەوە و تا رادەیەکی

زۆریش بۆته هۆی پارچەپارچەبوونی بزووتنەوەی گشتگیری کورد (چونکو هێزە هاندراوەکان لەدژی یەکتر پتر تێکۆشاون)، و لە لایەکی‌ترەوە هەر ئەو دەستێوەردانانە لەهێندێک لە هەرێمەکانی کوردانداندا یارمەتیدەری سەرکەوتنێکی سنووورداری خەباتی رزگاریخوازانەی بووە. ئەوە بریتی بوو لە دیالێکتیکی هەلومەرجی ژێئۆپۆلیتیک لە کوردستانی هاژاو دا کە هاوکات لەگەڵ کۆسپ هاویشتن لەسەر رێگای یەکگرتنەوەی هێزەکانی بەرهەڵستکاری نەتەوەیی لەسەر ئاستی تەواوی کوردستاندا، لە پارچەیەکی دیکەی کوردستاندا یارمەتیدەری پەرەسەندنی تێکۆشانی ئەو هێزانە بووە و لە ئاکامدا و لە سەردەمی هەنوکەییدا گەلێک سەرکەوتنی بۆ خەباتکارانی کورد لەپێناو ئازادی و سەربەخۆییدا پێشکەش کردووە.

مێژووی پێوەندیە دوولایەنەکانی کوردان لەگەڵ زلهێزە "دەرەکییەکان"دا (نە زلهێزەکانی رۆژهەڵاتی نزیک) فرە نموونەگەلی لەو شێوەیە لێکەوتۆتەوە کە کاتێک دەستێوەردانی ئەو زلهێزانە ئاکامی یەکلایەنەی لێکنەوتۆتەوە، و بەکردەوە ئەو زلهێزانە بۆنەتە هۆی بڵاوبوونەوەی ناسیونالیزمی کورد لەهەموو ئاستەکاندا، تەنانەت ناسیونالیزمی توندڕەوانەش. بۆ وێنە، لەکاتی شەڕی رووس-تورک لەسەدەی 19 و سەرەتای سەدەی 20دا، فەرماندەیی هێزە سەربازیەکانی رووس زۆرجار لە راپەڕینەکانی سەرۆک خێڵە کوردکان لەدژی دەسەڵاتی سوڵتانی تورک پشتیوانیان کردووە. هاندانی راستەوخۆی رووسیا لە جیاخوازی فێودالی کورد، کاردانەوەیەکی بەرچاوی لەسەر پەرەسەندنی ناسیونالیزمی کورد لە ساڵەکانی نێوان دوو سەدەی 19 و 20دا، داناوە. هەمدیسان لەو ساڵانەدا،

بەتایبەت لە ساڵەکانی سەرەتای دەسپێکی شەڕی یەکەمی جیهانیدا، دەوڵەتی رووسیا تەنانەت لەئاست نێودەوڵەتیدا لەگەڵ یەکەم ناسیونالیستە کوردەکاندا پێوەندی پێکهێنا. بەو شێوەیە، سەرەڕای هەوڵی ئەمپریالیستی رووسیەی تێزاری لە رۆژهەڵاتی نزیکدا، سیاسەتی ئەو دەوڵەتە بەکردەوە بزوێنەر و هاندەری بزووتنەوەی رزگاریخوازانەی کورد بووە.

هەروەها زلهێزەکانی‌تری وەک بریتانیا (لە پلەی یەکەمدا)، ئاڵمانیای قەیسەری و فەرانسا، هەوڵیان دا لە خەباتی کوردان لەپێناو سەربەخۆییدا، بۆ بەرژەوەندییەکانی خۆیان کەڵک وەرگرن، بەڵام، ئاڵمانیا و فەرانسا دەسکەوتێکی ئەو تۆیان وەدەست نەهێنا. بەڵام پاش کۆتایی شەڕی یەکەم، کورد لە ئێراق و سوریا کە لەکۆیلەتی سەدان ساڵەی عوسمانیەکان رزگاریان هات (خۆی لەخۆیدا هەنگاوێکی پێشکەوتووانە لەمێژوویاندا بوو) کەوتنە ژێر رەکێفی داگیرکەرانەی (کۆلۆنیالی) بریتانیا و فەرانسا. کوردستان دوچاری پارچەبوونێکی نوێ بووە و پاش پێکهاتنی عێراق و سوریا، دەکرێ بڵێین پارچەکانی دوو جاری‌تر زیادی کرد. بێگومان تەشەنەی وڵاتە داگیرکارە رۆژئاواییەکان لە خاکی کورددا، کێبەرکێی لەناو ئەو وڵاتانە پێکهێناوە (لەسەرەتا و لەدرێژایی شەڕی دووەمدا، زلهێزەکانی "تەوەری" فاشیستیش لە کێشمەکێشی پاوانکردنی قەلەمندارەی کوردستان بەشداریان کردووە) و خولقێنەری تێکهەڵچونی نوێ لەکێشەی کورد چ لەئاست نێوخۆیی و چ لەئاست نێونەتەوەییدا بووە کە بەئاڕاستەی جوراوجور تائێستاش هەر بەردەوامە.

لەکاتی خۆیدا. یەکێتی سوڤیەت دەورێکی گرنگی لەرووداوەکانی کوردستان گێڕاوە. ئەو دەورە دوو لایەنی بیرۆکەیی [ئایدیولۆژیکی] و سیاسی هەبووە. بەپێیێ ڕێبازی فەرمی و ئایدولۆژیکی سەبارەت بە پشتیوانی لە مافی چارەی خۆ نووسینی نەتەوەکان، یەکێتی سوڤیەت هەمیشە لە بزووتنەوەی نەتەوەیی-رزگاریخوازانەی کورد لایەنگری کردووە و هەر بەو هۆیەش لە ناسیونالیزمی کورددا باڵی چەپ، لەسەرەتادا بەلایەنگری ئاڕاستەی سوڤیەتی و کومۆنیستی پێکهات و لەکاتی شەڕی دووەم و پاشان توانی سەقامگیر بێت و بەردەوامیش لەگەڵ باڵەکانی‌تر، واتە لەگەڵ لایەنگرانی رۆژئاوا و بەئاڕاستەی نەریتە فیودالی و ئایین سالاری ناسیونالیزمی کورد، کەوتە ململانیەوە. لەکۆتایی چارکە سەدەی بیستەم و لەسەردەمی قەیرانی قووڵ و تێکڕووخانی سیستەمی سۆڤیەتدا، بنەڕەتخوازی مارکسیستی لێنینیستی بە روخساری مائوویستی-کاسترویی لە کوردستانی تورکیا (واتە کوردستانی باکوور-رۆژئاوا) پەرەی سەند و بەشێوەیەکی کاتی سەرکەوتنی وەدەست هێنا و ئاراستەی بزووتنەوەیەکی چەکداری بەرێبەرایەتی حیزبی کریکارانی کوردستان(پ.ک.ک)ی بەخۆوەگرت کە بەتایبەت لە تورکیا و ئێراندا کێشمەکێشێکی نێوخۆیی فرە جیددی لێکەوتۆتەوە.

بەڵام سەبارەت بە دەوری سیاسی (هەروەها سەربازی-سیاسی)، دەستێوەردانی یەکێتی سۆڤیەت لەکاروباری دەرەکی کورددا لەتەواوی ماوەی ژیانی خۆیدا، زۆر کەم بووە. لێرەدا هێندێک لایەنی‌تر گرنگی بۆی هەبووە: بەپێی توانا هەوڵدان بۆ دامەزراندن، راگرتن و قووڵکردنەوەی پێوەندییە دۆستانە و دراوسێیەکانی لەگەڵ

ئێران و تورکیا کە بەتوندی کاردانەوەی خراپی لەسەر پشتیوانی مۆسکۆ لە بزووتنەوەکانی کورد لەو وڵاتانەدا دانا. تەنیا لەکاتی شەڕی دووەم و دەسبەجێ پاش تەواو بوونی شەڕ و لەکاتی داگیرکردنی بەشێک لە کوردستانی ئێران لەلایەن سوپای سوورەوە، هەروەها لەکاتی راپەڕینی مستەفا بارزانی لە ئێراق لە شەستەکان و سەرەتای حەفتاکاندا، یەکێتی سۆڤیەت ئەو سیاسەتەی خۆی گۆڕی، مخابن نەدرێژخایەن، بەڵکوو لەژێر کاردانەوەی هۆکارە دەرەکییەکان ناچار بوو چارەنووسی کوردان بەخۆیان بسپێرێت.

وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا زۆر لەمێژ بوو سرنجێکی بەرچاوی بەناوچەی کوردستان و بەشداریکردنی لەکێشەکانیدا نەدەدا، بۆیە کاردانەوەی لەکاروباری وێندەرێ زۆر لاواز بوو. بەڵام ئێستا و بەتایبەت پاش چالاکی هێزە سەربازییەکانی بەناوی "تۆفان لە بیابان"دا کوردستان و لەپلەی یەکەمدا بەشی باشووری، کەوتۆتە ناو تەوەرەی ژێئۆپۆلێتیکی ئامریکا لە رۆژهەڵاتی نزیکدا و لەنێوەندی ئەو سیاسەتەدا جێیکردۆتەوە. لەژێر سایەی "چەتر"ی سەربازی ئامریکا (بە بەشداری بریتانیا) و بەهۆی کاردانەوەی سێڵاوی دۆلارەکانی نەوت لەبەرامبەر خۆراکدا، کوردستانی بەرواڵەت خۆدموختاری پێشوو لە عێراق، وەرچەرخا و بە ئابووری و کولتوورێکی بەرەو هەڵکشان و گەشە، بەکردەوە (چەلێ نە لەباری حقوقییەوە) بۆتە وڵاتێکی سەربەخۆ (کوردستانی ئازاد بەشێوەیەکی فەرمی خۆی بە بەشێکی ئێستا پێکنەهاتووی عێراقی فێدرالی دەزانێ) [ئەم وتارە لەساڵی 2005دا نووسراوە]. بەم شێوەیە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا کە بەگوێرەی هەلومەرج، ئەرکی پەروەردەکردنی یەکەم پێگەی

سەربەخۆیی کوردی کەوتۆتە سەرشانی، کەرەسەی نوێ و یەکجار بەهێزی وەدەستهێناوە بۆ هەڵسوکەوت کردن لە دۆخە هەنووکەیی و پاشەرۆژیەکاندا لە یەکێک لەناوچە هەرە قەیراناوی و مەترسیدارەکانی رۆژئاوای ئاسیادا. لێرەدا ئامریکاییەکان بەتایبەت شوێنێکی بەسوودیان بۆخۆیان دابین کردووە کە رێگەی پێداوە بەشێوەیەکی کارا تێکەڵاوی دەرەنجامی کێشە فرەناکۆکە نێوخۆییەکانی کوردیش ببێتەوە.

بەکورتی، کوردستانی هاوچەرخ بریتییە لە ناوچەیەکی دەوڵەمەند لە ناتەباییەکان لەئاست هۆکارە نێوخۆیی و دەرەکییەکانەوە کە سەرچاوە و سرووشتیان لەباری مێژووییەوە مەرجدارن و هەروەها هەڵگری ناوەرۆکێکی زیندوو و چالاکن. لەسەر بنەمای ئەم شرۆڤەیە بەگوێرەی ئەو هەلومەرجە کورتەی سەرەوە، دەتوانین پەرەسەندنی رووداوەکان لەداهاتوودا، بەو شێوەیە پێشبینی بکەین:

- کێشەی کورد بەگشت قەوارە و ناوەرۆکییەوە، بەختێکی بەهێزی هەیە ببێتە کێشەی سەرەکی رۆژهەڵاتی نزیک لە سەدەی 21مدا. هاوکێشەکان لە کوردستانی پارچەکراودا ناوەرۆک و ناخێکی بێگەڕانەوەیان وەدەستهێناوە و تەنانەت بەگوێرەی گشت بنەماکان ئەگەری قووڵبوونەوە و پەرەسەندنی شێمانە دەکرێت. هەوڵی تاقمە دەسەڵاتدارەکانی هێندێک لە وڵاتانی رۆژهەڵاتی نزیک بۆ بەستنەوە یان "دەستەمۆ" کردنی بزووتنەوەی کورد، بێ ئەملاو ئەولا شکست دێنێت و بارگرانی و گرژی نەرێنی دیسان زۆرتر دەخاتە سەر هاوکێشەی کورد.
- دەستێوەردانی هێزە ناوچەیی و دەرەکییەکان لە کێشە نێوخۆییەکانی کورددا بەناچاری دەبێتە هۆی بەربڵاویی زیاتر و ئاڵۆزی

فرەتری کێشەکە و گەلێک ئاکامی پێشبینی نەکراو و فرە لایەنەی لێدەکەوێتەوە. ئەگەرکو ئەو دەستێوەردانە دژایەتی راستەوخۆ لەگەڵ بەرژەوەندی نەتەوەیی بکاتە ئامانجی خۆی، بێگۆمان ئەوکاتیش رەنگە تەنیا سەرئەنجامێکی نەرێنی لێبکەوێتەوە. ئەگەرکو ئەو دەستێوەردانە بەتایبەتی لەسەر بەستێنی سیاسی یەک لایەنانەی ئەم یان ئەو زلهێز لە کوردستان رووبدات، لەوانەیە ئاکامێکی بەسوودی بۆ بزووتنەوەی کورد لێهەڵوەرێت و بەڕاستیش ئاکامی خستنەژێر چاوەدێری ئاسمانی باشووری کوردستان پاش شەڕی کەنداو لەلایەن وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا (لەپلەی یەکەمدا) و بریتانیاوە، و هەروها یارمەتی ئابووری-دراویی و سیاسی و مرۆڤانەی وڵاتانی رۆژئاوا بۆ کوردی عێراق، ئەو دەسکەوتەی لێبۆتەوە.

- بەگشتی، دژواری و ئاڵۆزی هەنووکەیی لە هەلومەرجی سیاسی نێوخۆی کوردستاندا کە پڕە لە هاوکێشە جوربەجورەکان، هەرگیز بەو مانایە نییە کە وڵات ئاژاوە دایگرتووە و پەرشوبڵاویی و بێسەرەوبەری دەسەڵات دەکات. کۆمەڵگای کوردەواری ژیانی قۆناخی دژواری ئاڵوگۆڕ و پەڕینەوە تێپەر دەکات، ئەو کۆمەڵگایە سەرەڕای ئامێزەبوونی بە "پارتیکۆلیاریسمی" لەمێژینەی کە تەنیا خێڵی دوژمنانی ئازادی و سەربەخۆیی کورد سوودی لێوەردەگرن، هەمدیسان گەشە دەستێنێت و لەپێناو یەکگرتنەوەی هەموو هێزە بەرهەڵستکارەکانی نەتەوەییدا خواست و ویستە ناتەباکان رێکدەخات. کورد دەستی کردووە بە هەلێنجانی وانە لە مێژووە دژوارەکەی خۆی و بەربەرکانی کردن لەگەڵ هۆکار و ئەنجامە نەرێنییەکانی دووبەرەکی نێوخۆیی و لەناوبردنی دڵێشە و تۆرانە کۆن و لەمێژینەکان. بەرز

بوونەوەی ئاستی کولتووری سیاسی لە بزووتنەوەی نەتەوەیی کورد بەئاشکرا دەبیندرێت، و لەگەڵ ئەمەشدا ئاسەوارە مەرگهێنەرەکانی دەستێوەردانی مەبەستداری هێزە دوژمنکارە دەرەکییەکانی بزووتنەوەی کورد، لەناو دەچێت. کورد دەستی کردووە بە پێکهێنانی رێبازێکی نەتەوەیی پتەو و خۆماڵی و ئەو رێبازە بێوچان بەکار دێنێت. ئەوەش باشترین دەرمانە بۆ نەخۆشی کۆنی پارتیکۆلیاریسمی دووبەرەکی سازکەر کە هەمیشە گەلی کورد لەدەستیناڵیوە. تا سەرکەوتنی هەمەلایەنەی ئەو هەڵوێستە تازە پشکوتوو و تەندورستە بۆ یەکخستەوە و یەکگرتنەوەی هەموو هێزە بەرهەڵستکارەکانی کۆمەڵگای کورد، رێگایەکی زۆر لەپێشە، بەڵام یەکەم دەسکەوتەکان لەبەرامبەرماندا دیارن، بۆیە بنەمایەکمان دەداتێ تا بە گەشبینی پروانینە داهاتووی خەباتی نەتەوەیی و رزگاریخوازانەی گەلی کورد.